لەڕاستیدا ناوبانگی مەکتەبی تەنفیزی بۆ شۆڕش، لە ناوبانگی مەکتەبی سیاسی بۆ پارتی زیاتر بوو، چونکە ئەو هاوشێوەی ئەو دەسەڵاتە کارگێرییە بوو کە سەرپەرشتی جێبەجێکردنی بڕیارەکانی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی دەکرد (محمد، ٢٠٢١، ل٧٥).

سەبارەت بە مێژووی هەڵوەشاندنەوەی ئەو دامەزراوەیە، هیچ بەیاننامەیەکی فەرمی یان سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراومان لەبەردەستدا نییە، بەڵام بەڵگەنامەیەکی حکومەتی ئەمریکا بەپشت بەستن بەو زانیاریانەی لەلایەن نوێنەرێکی سەرکردایەتی شۆڕشی کورد بەدەستی گەیشتووە، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات که لە دوای ڕێککەوتنی ١١ی ئاداری ١٩٧٠، کوردەکان ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستانی عێراق و مەکتەبی تەنفیزیان هەڵوەشاندەوە (.FRUS, 1969–1976, Volume E–4, July 16, 1971)

لەلایەکی دیکە بەپێی زانیارییەکانی توێژەرێک مەکتەبی تەنفیزی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستانی عێراق تا ساڵی ١٩٧٤ بوونی هەبووە و هیچ گۆڕانکارییەک بەسەر پێکهاتە و شێوازی کاریدا نەهێنرا، لەگەڵ ئەوەشدا بەتایبەتی دوای مۆرکردنی ڕێککەوتنی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ مەکتەب هیچ دەسەڵاتێکی نەما. دواجار سەرکردایەتی شۆڕشی کورد لەکۆتایی مانگی ئاداری ١٩٧٤ بۆ بەڕێوەبردنی ناوچە ئازادکراوەکان پرۆژەیەکی نوێی جێبەجێکرد (محمد، ٢٠٢١، ل١٣٧). کە لە باسی داهاتوو، زانیاری لەسەر دەخەینەڕوو.

**٦- دامەزراندنی ناوچەی ئۆتۆنۆمی و یەکە کارگێرییەکان لە ناوچە ئازادکراوەکان**

دانوستانەکانی حکومەتی عێراقی و سەرکردایەتی شۆڕشی کورد لەساڵی ١٩٧٠، ڕێکەوتننامەی ١١ی ئاداری لێکەوتەوە، بەپێی ئەو ڕێکەوتنەی ئەنجامدرا، حکومەتی عێراقی ڕەزامەندی نیشاندا بە دامەزراندنی ناوچەی ئۆتۆنۆمی لە باشووری کوردستان وەک وەڵامدانەوەیەک بۆ داخوازییەکانی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردی لەو کاتەدا (کۆچێرا، ٢٠١١، ل٣٥٧).

لە ڕۆژنامەی دەستووری ئوردنیدا هاتووە ئەو ڕێککەوتنامەیە بەپێی ئەو بەیاننامەی لە ١١ی ئاداری ١٩٧٠ ڕاگەیەنرا، (١٥) خاڵی لەخۆگرتبوو (الدستور(جريدة)، ع(1048)،12 أذار 1970، ص١). لەدیارترین ئەو خاڵانەشی لەبەیاننامەکەدا هاتبوو، بریتی بوو لە ئەنجامدانی سەرژمێری بۆ دیاریکردنی ناوچەی ئۆتۆنۆمی[20]، لە بەڵگەنامەیەکی ئەمریکیشدا باسی ئەوە کراوە کە هەر بەپێی یەکێک لە خاڵەکانی ڕێکەوتنامەکە، سەرکردایەتی شۆڕشی کوردی ڕەزامەندی دەربریوە لەسەر هەڵوەشاندنەوەی دامەزراوەکانی بەڕێوەبردن لەناوچە ئازادکراوەکانی ژێر دەسەڵاتی شۆڕش، بۆئەوەی دوو دەسەڵاتی کارگێری لەیەک ناوچەدا نەبن (( FRUS, 1969_1976, Volume E_4,1971).

هەرچەندە لەسەر بنەمای ئەو ڕێککەوتنە، سەرکردایەتی کورد پابەندی بەشێکی زۆری بەڵێنەکانی خۆی بوو، بەتایبەت ئەوەی پەیوەندی هەبوو بە هەڵوەشاندنەوەی دامەزراوەکانی بەڕێوەبردن لەمانەش ئەنجوومەنی سەکردایەتی شۆڕشی کوردستانی عیراق و مەکتەبی تەنفیزی، بەڵام حکومەتی عیراقی هیچ هەنگاوێک بۆ جێبەجێکردنی ڕێککەوتنامەکە نەهاتە پێشەوە لەچەند خاڵێکی سادە نەبێ، بەو هۆیەشەوە پەیوەندییەکان لەنێوان هەردوولا، بەهۆی ماوەی درێژی بڕیار لەسەردراو بۆ جێبەجێکردنی ڕێکەوتنامەکە ساردی و ئاڵۆزی تێکەوت[21].

ئەوەبوو دواجار حکومەتی عیراقی تاک لایەنە و بەبێ گەڕانەوە بۆ سەرکردایەتی شۆڕشی کوردی لە ١١ی ئاداری ١٩٧٤ بڕیاری پرۆژەی ئۆتۆنۆمییەکی کارتۆنی لە سنوورێکی دیاریکراوی باشووری کوردستان کە تەنها بەلای خۆیەوە پەسەند و گونجاو بوو ڕاگەیاند (P.Chapman, 2009, p.16).

پرۆژەکەی حزبی بەعس بەلای بارزانی و سەرکردایەتی سیاسی و گەلی کوردستان پەسەندو گونجاو نەبوو (FCO, 8/2308, Kurds in Iraq, 1974, p.161)، بەو هۆیەوە مستەفا بارزانی لە ١٨ی ئاداری ١٩٧٤ لەگەڵ مەحمود عوسمان بۆ چارەسەرکردنی و بەدەستهێنانی پشتگیری و کۆمەکی دارایی و سەربازی، سەردانی شای ئێرانی کرد (CIA, 741503699,Helms to Scowcroft re Mulla Mustafa Barzani and Dr. Uthman, March 1974) بەتایبەتی لەو کاتەدا سەرکردایەتی سیاسی کورد، زیاتر پێویستی بە هاوکاریی مرۆیی هەبوو لە جلوبەرگ و خۆراک و خیوەت و پێداویستی دیکە بۆ حەوانەوەی ئەو پەنابەرانەی ڕوویان لە ناوچە ئازادکراوەکان کرد (FRUS, 1969–1976, VOLUME XXVII, Washington, March 21, 1974).

ئەوە سەرەڕای ئامانجەکانی بۆ بەڕێوەبردنی شۆڕش و هەموو ئەو خەڵکەی لەژێر سەرپەرشتی شۆڕشەکەدا بوون لەناوچە ئازادکراوەکان، بەتایبەتی کە دوای ئەو ڕووداوە، ڕووبەرێکی فراوانی خاک، بەگوێرەی زانیاری یەکێک لە ژێدەرەکان بە نزیکەی (٣٥٠٠) کم٢ دەبوو (کۆچێرا، ٢٠١١، ل٣٩٩)، کە نزیکەی یەک ملیۆن کەس تێیدا نیشتەجێ بوون، کەوتنە ژێر دەسەڵاتی هێزی پێشمەرگە. ئەم خاکە بریتی بوو لە ناوچەکانی ڕەواندز و قەڵادزە و ڕانیە و ناوچەکانی سنووری ئێران تاکوو هەڵەبجە و تەواوی ناوچە سنووریەکانی تورکیا لەگەڵ عێراق (FRUS,1969–1976, Volume XXVII,Tehran, March 18, 1974, p.678).

بەپێی زانیارییەکانی موحسین دزەیی سەرکردایەتی شۆڕشی کورد، لەمانگی نیسانی ١٩٧٤ دوای ئەنجامدانی چەندین کۆبوونەوە، بڕیاری پێکهێنانی دامەزراوەکانی بەڕێوەبردنی لەناوچە ئازادکراوەکاندا، لە شێوەی ئەمینداریەتیە گشتییەکان و ئەنجوومەنی ئەمینداریێتییەکان. بەشێوەیەک ئەو ئەنجوومەنە لە ئەمیندارەتییە گشتییەکانی ناوەخۆ ، پەروەردە ، ئەشغال ونیشتەجێکردن ، دارایی ، داد و ئەوقاف، تەندروستی، کشتوکاڵ پێکهات (دزەیی، ٢٠١٣، ص٢٧٠).

پێکهاتەی بەڕێوەبردنی ئەو قەوارە سیاسی و کارگێرییە، لەناوچەکانی نێوان ڕێگای هاملتۆن لە حاجی ئۆمەرانەوە تاکو ناوپردان دامەزرێندران. حاجی ئۆمەران بەشێوەیەکی رانەگەیەنراو بووە پایتەختی ئەو قەوارە کوردییە (کۆچێرا، ٢٠١١، ل٤٠٠).

هەریەکێک لەو دامەزراوانە، خاوەنی پەیکەری کارگێری تایبەت بە خۆیان بوون، بەشێوەیەک کاروباری ناوەخۆ لەلایەن موحسین دزەیی سەرپەرشتی کراوە، ئەرکەکەی بریتی بوو لە دابینکردنی ئاسایشی ناوچە ئازادکراوەکان و سەرپەرشتیکردنی کاروباری پەنابەران و بەخشینی مۆڵەتی پشوودان وسەردانیکردنی خێزانەکانیان بە فەرمانبەرانی دامەزراوەکانی بەڕێوەبردنی شۆڕش بۆ چوونە ناو سنووری ئێران (کۆچێرا، ٢٠١١، ل٢٨٧).

کاروباری ئەمینداریێتی گشتی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن و لاوان لەلایەن دارا توفیق سەرپەرشتی کراوە و بریکارەکەی کەمال سەعید خەیات بووە. ئەو دامەزراوەیە یەکێک بوو لە ئەمیندارەتییە چالاکەکان و ڕۆڵێکی کاریگەری لەناو شۆڕشدا بینیوە، بەهۆی بایەخدانی بەلایەنی ڕۆشنبیری کوردی، بەتایبەتی بەرێوەبردنی ئیستگەی(دەنگی کوردستان) و بڵاوکردنەوەی گۆڤارەکانی(دەنگی پێشمەرگە) و پاشبەندی دەنگی پێشمەرگە (کادیر) و (دیاری لاوان) (ساڵح، ٢٠٢١، ل٣٥٦).

ئەمینداریێتی گشتی پەروەردە. یەکێک بووە لە پرکارترین دەزگای کارگێری حکومەتی کوردستان و بووە پەناگەی ئەو قوتابی و خوێندکارانەی پەیوەندییان بە شۆڕشی کوردەوە کرد (ئ. ساڵح، ٢٠٠٧، ل٢٥٢). سەرکردایەتی کورد سووربوو لەسەر ئەوەی کارێکی وەها بکەن کە ئەو کیژ و کوڕە خوێندکارانەی زانکۆ کە پەیوەندییان بە شۆڕشەوە کردبوو لە کوردستانی ئازادکراودا درێژە بەخوێندن بدەن (کۆچێرا، ٢٠١١، ل٤٠١).

بەشێوەیەکی گشتی ئەنجوومەنی ئەمیندارەتیە گشتییەکان، لە هەموو هەفتەیەک یەکجار بۆ گفتوگۆکردن لەسەر پێداویستی خەڵک و کاروباری سیاسی و سەربازی کۆدەبوونەوە. هەر لەو هەفتەیەشدا ڕۆژێک لەکاتی ئێواران لەبارەگای بارزانی کۆبوونەوەیەکیان بەسەرپەرشتی مستەفا بارزانی ئەنجامداوە، بۆ قسەکردن لەسەر چۆنییەتی بەڕێوەچوونی کاروباری دامەزراوەکانی بەرێوەبردنی شۆڕش (دزەیی، ٢٠١٣، ص٢٧٩).

لەلایەکی دیکە مستەفا بارزانی لە سەردانێکدا کە لەئایاری ١٩٧٤ کردی بۆ تارانی پایتەختی ئێران ، وەک لە بەڵگەنامەیەکی ئاژانسی هەواڵگری ئەمریکادا هاتووە، پێشنیازی پرۆژەی ئۆتۆنۆمی پارتی دیموکراتی کوردستانی لە ڕۆژی ١٦ی ئایار خستە بەردەم کاربەدەستانی سیاسی ئەمریکا و ئێران[22]، بۆ ئەوەی پشتگیری ڕاگەیاندنی ناوچەی ئۆتۆنۆمی بکەن، لە ڕێگای دانپێدانانیان بەو قەوارە سیاسییەی ئامانجیانە دایبمەزرێنن و هاوکات هاوکاری دارایی پێویستی بۆ دەستەبەربکەن (FRUS,1969_ 1976, Volume XXVII, Washington, April 17,1974).

ڕۆژنامەی نەهاری لوبنانی لە راپۆرتێکیدا کە لە ئایاری ١٩٧٤ بڵاویکردۆتەوە، ئاماژەی بۆ ئەوە کردوە پارتی دیموکراتی کوردستان ئامادەسازی ئەنجامداوە بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی تاک لایەنە، پرۆژەی ئۆتۆنۆمی ڕابگەیەنێ. ئەو زێدەرە لەسەر زاری مەحمود عوسمان بڵاویکردۆتەوە کە پارتی دیموکراتی کوردستان، مکوڕە لەسەر ڕاگەیاندنی ئۆتۆنۆمی لە کوردستان. بەپێی ڕاپۆرتە ڕۆژنامەوانیەکە، پرۆژەی ئۆتۆنۆمی کوردی لەسەر بنەمای ناچارکردنی حکومەتی عێراق بەدانپێدانان بەو ئۆتۆنۆمییەی کورد ڕایدەگەیەنێ هەنگاوی بۆ هەڵێنراوە. ئەمەش بەپێی خەمڵێنی ئەو زێدەرە بەو مانەیە دێ کە ئەو پارتە، ئومێدی ئەوەیە رژێمێکی دیموکراتی و پێشکەوتنخواز لە باکووری عێراق دابمەزرێنی، کاریگەرییەکانی ئەو رژێمەش بەو ڕادەیەبێ، بتوانی ڕێگربێ لەبەردەم دروستبوون یان بەردەوامبوونی هەر رژێمێکی سیاسی کە بەشێوەیەکی دیکتاتۆری لەبەغدا حوکمڕانی بکات (الزعماء الاكراد قد يعلنون الحكم الذاتي من جانب واحد، النهار(جريدة)، ٩ ايار ١٩٧٤، ص١٢).

مستەفا بارزانی بەئامانجی بەدەستهێنانی دانپیدانانی حکومەتی ئەمریکا بەو دەسەڵاتە ناوخۆییە و پرۆژەی پیشنیازکراوی ئۆتۆنۆمی شۆڕشی کورد، لە٢٢ تشرینی یەکەمی ١٩٧٤ نامەیەکی بۆ وەزیری دەرەوەی ئەمریکا هنری کسنجەر نووسی. لەو نامەیەدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە " عێراقیەکان ڕیکاری دیاریکراویان بۆ جێبەجێکردنی ئەوەی ناوی لێ دەنێن(یاسای ئۆتۆنۆمی) گرتۆتەبەر کە تایبەتە بەخۆیان. دەستیان کردوە بە پێکهێنانی دامەزراوەکانی تەشریعی وتەنفیزی. ئەو رێکارە ڕووکەشیانە بەلای زۆرینەی گەلی کورد پەسەندکراونین، بەڵام رەنگە ئەو هەوڵە چەواشەکاریانە کاریگەریی لەسەر جیهانی دەرەوە هەبێ، لەلای خۆمانەوە پێویستە

جێگرەوەیەکمان هەبێ لەڕێگای راگەیاندنی شێوازێکی سەربەخۆیی ێوخۆیی بۆ گەلەکەمان لە کوردستانی عێراق، یان دامەزراندنی حکومەتێکی عێراقی باوەڕپێکراو لەناوچەکەمان، لەپێناو ئەوە پێویستە یەکێک لەو ڕێکارانە جێ بەجێ بکەین". بڕوای حکومەتی ئەمریکا وابوو ڕاگەیاندنی ناوچەی ئۆتۆنۆمی لەلایەن سەرکردایەتی شۆڕشی کورد، بڕیارێکی حەکیمانە نییە، لەسەر ئەو بنەمایە سەرکردایەتی شۆڕشی کورد، کاتێک تێگەیشتن لەوەی پرۆژەکە پشتیوانی نێودەوڵەتی بەدەست ناهێنێ. بریاری ڕاگەیاندنی پرۆژەی ئۆتۆنۆمیان هەڵپەسارد و بڵاویان نەکردەوە (CIA, LOC- HAK- 173-7-14-7, 2 November 1974, p.3)

**٧_ئەنجام:**

**لەم توێژینەوەدا گەیشتینە ئەم ئەنجامانەی خوارەوە:**

1. مستەفا بارزانی لە ڕێگای پێکهێنان و سەرکردایەتیکردنی ڕێکخراو و دامەزراوە سیاسییەکان، توانی پلۆرالیزمی سیاسی و کۆمەڵایەتی لەنێو پێکهاتەی کۆمەڵگەی کوردستان دروست بکات. لەڕووی سیاسییەوە بەهۆی بەستنەوەی هێز و پارتە سیاسییە کوردییەکان، بەبزاڤی رزگاریخوازی نەتەوەیی کوردی لەباشووری کوردستان، لەرووی کۆمەڵایەتیشەوە، جیاوازییە چینایەتییەکانی کاڵکردنەوە بەتێکەڵکردنی ئاغا و جووتیار، گوندی و شاریی لەبازنەی خەباتی سیاسی و چەکداری دا.
2. لەپێناو برەودان بە بزاڤی رزگاریخوازی نەتەوەیی کوردی، وێرای ئەو ئاڵەنگەرییانەی ڕووبەڕوویان بوونەوە، بارزانی توانی بەهەندێ ڕێکاری سیاسی، سنوورێک لەبەردەم دیاردەی لێکترازان و جیابوونەوە و دابەشبوون دابنێ، بە بەخشینی متمانە و ڕۆڵپێدان بە بەشێکی کوردانی ناوچە جیاوازەکانی کوردستان لە عێراق و ئێران و سوریا و تورکیا، لەنێو بزاڤی رزگاریخوازی کوردیدا لە باشووری کوردستان، وەک ڕێگایەک بۆ یەکخستنی هەوڵی نیشتمانپەروەرانی کورد و پاشان پڕکردنەوەی ئەو بۆشایی و کەلێنانەی لە بزاڤی رزگاریخوازی کوردیدا دروست دەبوون، بەبێ ئەوەی هیچ یەکێک لەمانە ناچار بکات، پابەندی ئایدیا و ڕێبازێکی فیکری دیاریکراوی حزبی سەر بەخۆی بن. بەم جۆرەش ڕووبەری شۆڕشی کوردی بەرفراوان کرد.
3. مستەفا بارزانی بەدرێژایی خەباتی سیاسی خۆی، حزب و رێکخراوی سیاسی وەک ئامراز بینیوە و مامەڵەی لەگەڵدا کردوە، بۆ پێکاندنی ئامانجێکی گەورە کە سەرخستنی دۆزی کورد بوو.
4. بەهۆی ڕێکخستنەکانی حزب، بارزانی توانی لەبەشێکی زۆری خەڵکی کوردستان نزیکبێتەوە و ڕۆڵی کاریگەریی پێیان بەخشی، بۆئەوەی بەگشتی بەشداربن لە خەبات سیاسی و چەکداری لە پێناو ئازادی و سەربەخۆیی کوردا.
5. بەشێکی زۆری هۆزەکانی کوردستان لە پابەندبوون بە سنووری هۆز و سەرۆکی ئێلەکەیان، بە هەوڵە سیاسییەکانی مستەفا بارزانی، وەچەرخان بۆ کۆمەڵێکی شۆڕشگێری خۆبەستاوە و پابەند بە بزاڤی رزگاریخوازی کورد و لەدەوری یەک ئامانجی هاوبەش کۆی کردنەوە، ئەمیش بەدیهێنانی سەربەخۆیی و رزگاری گەلی کورد و نیشتمانەکەی بوو.

**٨- پێشنیار و ڕاسپاردە**

1. دوای ئەنجامدانی ئەو توێژینەوە، بە گرنگ و پربایەخی دەزانین ئەم چەند پێشنیار و ڕاسپاردانەی خوارەوە بخەینەڕوو:
2. پێداچوونەوە و ئەنجامدانی توێژینەوەی نوێ لەسەر مێژووی هاوچەرخی کورد بە پشت بەستن بەبەڵگەنامە فەرمییەکانی لەلایەن حکومەتەکانی ئەمریکا و بەریتانیا ئێستاکە بەردەستن، جگە لەوانەی لەخانەی کتێب و بەڵگەنامەکانی عێراق و ئێران و تورکیا پارێزراون، بۆ ساخکردنەوەی هەندێ لەو ڕاستیانەی تاکو ئێستاکە نەخراونەتەڕوو.
3. گرنگیدان بەو توێژینەوە زانستییە نوێیانەی کە لە گۆڤارە زانستییە نێودەوڵەتیەکان لەسەر مێژووی کورد و کەسایەتییەکانی بڵاودەبێتەوە، ئەوە سەرباری بەشێکی دیکەی ئەو سەرچاوانەی وەک توێژینەوەی زانستی و کتێبی مێژوویی (بەزمانە بیانییەکان نووسراون) . وێرای پێویستی گەڕانەوە بۆ ئەو گۆڤار و ڕۆژنامە نێودەوڵەتیانەی هاوسەردەمی ڕووداوەکان بوون.
4. گرنگیدان بەلایەنی شارستانی ژیان و شۆڕشەکانی گەلی کورد ، یەکێکە لەبابەتە پێویستەکانی ئەو قۆناغە مێژووییە. لەپێناو گۆڕینی ئەو ێروانینەی بەهۆی سیاسەتی رژێمە حکومرانەکانی دەوروبەری کوردستان لە خستنەڕووی زانیاری نادروست لەسەر شۆڕشەکانی کورد کە وەک هەڵگەڕانەوە و شۆڕشگێرانیان وەک چەتە ورێگر لە دیدی خەڵکی بیانی و ێوەندە ێودەولەتییەکان لەو قۆناغە مێژووییە وێنا کردووە.

5. گرنگیدان بە ئەنجامدانی توێژینەوەی شیكاری لە نووسینەوەی مێژوویی هاوچەرخی كورد و دووركەوتنەوە لە پیادەكردنی شێوازی گێرانەوەیی مێژوویی. لەپێناو بەرزكردنەوەی توانای توێژەر بۆ دەستنیشانكردنی خاڵە بەهێز و لاوازەكانی بزاڤی رزگاریخوازی نەتەوەیی كورد، بەدرێژایی قۆناغە مێژووییەكانی.

## ٩- پەراوێزەكان

١- ئەم رێكخراوە سیاسییە لە بنجدا ناوی(كۆمەڵەی هیوا)یە. بەڵام لەبەرئەوەی بەڕاستی حزبێكی سیاسی بوو بەهەموو ماناكانی، بۆیە ناوی حزبمان بۆ بەكارهێناوە. بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ئەو حزبە و پشتیوانیكردنی لە شۆڕشی دووەمی بارزان، بڕوانە: (المزوري، ٢٠٠٨، ص١٥١- ١٨٧).

٢- خۆیبون: كۆمەڵەیەكی سیاسی كوردی بوو، لەساڵی ١٩٢٧ دامەزراوە. ڕۆڵی گرنگی لە جوولانەوەی رزگاریخوازی كوردیدا بینیوە، بەتایبەتی لە ڕێكخستن و سەركردایەتیكردنی ڕاپەڕینی ئاراراتی لە ساڵی ١٩٣٠. شیاوی باسە ئەم كۆمەڵەیە لە ساڵی ١٩٤٣ ئالای كوردستانی ناردووە بۆ مەلا مستەفا بارزانی ، بۆ ئەوەی لە شۆڕشی دووەمی بارزان لەسەر چیا سەركەشەكانی باشووری كوردستان هەڵیبكات. بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ئەم كۆمەڵەیە و پشتیوانی لە شۆڕشی دووەمی بارزان، بڕوانە: (حصاف، تاريخ كردستان سوريا المعاصر(1916-1946)،ج1،2017،ص٣٠١- ٣١٤)؛ (شیرگوە، 1986،ص107-111).

٣- كۆمەڵەی ژیانەوەی كورد(ژ.ك): ژمارەیەكی كەم لە ڕوناكبیران و ڕۆشنبیران و كاسبكارانی شاری مەهاباد كە ژمارەیان(١٥) كەس بوو لە ١٦ی ئابی ١٩٤٢ لە نزیك چەمی سابلاخ لە باغی(حاجی داود) كۆبوونەوە و ئەم ڕێكخراوەیان پێكهێنا. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (قادر، ٢٠٠٥، ل٥٦-٦٣).

٤- بۆ وێنەی نامەكەی (ژ.ك) بۆ بـــارزانی، بڕوانە پاشـــكۆی ژمارە (١).

٥- دەستەی دامەزرێنەرانی لێژنەی ئازادی جگە لە مستەفا بارزانی كە سەرۆكی ڕێكخراوەكە بوو، پێكهاتبوون لە: عیزەت عەبدولعەزیز، مستەفا خۆشناو، عەبدولحەمید باقر، محەمەد محمود قودسی، ئەحمەد ئیسماعیل، شەوكەت نعمان، حەفەزوڵا ئیسماعیل. (سوڵتانی،١٣٩٩ش،ل١١٢).

٦ - پێتەكە ئاماژەیە بۆ شاری بەغدا، ( ئەردەلان، ٢٠٢٢، ل٤٣).

٧ - سەرەتا ئەو حزبە ناوی پارتی دیموكراتی كورد_ عیراق بوو، پاشان لە كۆنگرەی سێیەمی كە لە ٢٦ی كانوونی دووەمی ١٩٥٣ بە نهێنی لە كەركوك ئەنجامدرا، ناوەكەی گۆردرا بۆ ( پارتی دیموكراتی كوردستانی_ عیراق). لەدوای مۆڵەت وەرگرتنی لە ٩ی شوباتی ١٩٦٠ گۆڕانێكی دیكەی كەم بەسەر ناوەكەیدا هات و بووە( پارتی دیموكراتی كوردستان). بڕوانە: (طالباني، 1970، ص١٠١).

٨- میر حاج ئەحمەد تاهیر ئاكرەیی: ساڵی ١٩١١ لە ئاكرێ لەدایك بووە. ساڵی ١٩٣٦ لە كۆلێجی سەربازی لە بەغدا دەرچووە. ساڵی ١٩٣٩ چۆتە ریزی ڕیكخستنەكانی پارتی هیوا. ساڵی ١٩٤٤ پەیوەندی بەبارزانی كردوە.. ساڵی ١٩٨٨ كۆچی دوایی كردوە. (سەرنی، ٢٠١٨، ل٣٩).

٩- نوری ئەحمەد تەها: لە ٨ی ئابی ١٩٢١ لە دەرگەزین لە شاری سلێمانی لەدایك بووە. لە ٢٧ی كانوونی یەكەمی ١٩٣٨ چۆتە كۆلێجی سەربازی و بەپلەی مولازم دەرچووە. ئەندامی حزبی هیوا بووە. ساڵی ١٩٤٦ پەیوەندی بە پارتی دیموكراتی كوردستان كردووە. لە ڕۆژی ٢١ی ئایاری ١٩٩١ لە سەردەشت كۆچی دوایی كردووە. (مراد، 2021، ص46).

١٠- حزبی شۆڕش: لە تشرینی یەكەمی ١٩٤٥ بەسەرۆكایەتی ساڵح حەیدەری دامەزراوە ، لە بنجدا لقی كوردی ڕێكخراوی (یەكێتی تێكۆشین) بوو. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (الخرسان، 2001، ص٦٥).

١١- حزبی ڕزگاری: لە كۆتایی ساڵی ١٩٤٤ و سەرەتاكانی ساڵی ١٩٤٥، بیرۆكەی پێكهێنانی بەرەیەكی نیشتمانی كوردی لەلایەن هێزە نیشتمانپەروەرەكانی كورد لە كوردستان گەڵاڵە بوو، لەپێناو مافی چارەی خۆنووسین و ڕزگاركردنی كوردستانی گەورە و ڕووبەڕووبوونەوەی ئیستعمارو دژایەتیكردنی سیستەمی دەرەبەگی. حزبی شۆڕش هەوڵی زۆریدا لەگەڵ هەندێك لەئەندامە چالاكەكانی حزبی هیوا لە بەغدا و چەند ڕێكخراویكی دیكەی وەك (ڕێی ڕاست) بۆ دروستكردنی حزبێكی نوێ. ئەوەبوو ڕێككەوتن لەسەر دامەزراندنی (حزبی رزگاری). بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (البارزاني، ٢٠٠٢، ص٩٩).

١٢- دەستەی دامەزرێنەرانی پارتی دیارترینیان ئەمانە بوون ( مستەفا بارزانی- سەرۆك)، (لەتیف شێخ مەحمودی حەفید- جێگری یەكەم)، ( كاكە زیاد ئاغا- جێگری دووەم)، ( هەمزە عەبدوڵڵا- سكرتێری لێژنەی مەركەزی)، و ئەندامیەتی( تەها محێدین مەعروف، میرحاج ئەحمەد، مستەفا خۆشناو، ساڵح عەبدوڵڵا یوسفی، عەلی عەبدوڵڵا، عەبدولكەریم توفیق. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (الخرسان، ٢٠٠١، ص ٥٥).

١٣- ئەندامانی سەركردایەتی پێكهاتبوون لە ( مستەفا بارزانی- سەرۆك، میرحاج ئەحمەد ئاكرەیی، محەمەد نەجیب بەرواری، عەبدوڵڕەحمان موفتی ئامێدی، سلێمان بەگ دەرگەڵەیی، شێخ سولەیمان بارزانی، عەلی محەمەد سدیق)، لە ڕۆژهەڵاتی كوردستانیش( سەید عەزیز سەید عەبدوڵڵا، رەحیمی قازی، مستەفا سەلماسی، حەسەن حیسامی، رەحمان گەرمیانی، سەید كەریم، كاك موراد). بڕوانە: مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی كورد(١٩٣١-١٩٥٨)،ل١٩٨)؛ (دەرگەلەیی، ٢٠٠٢.،ل١٩٤).

١٤ - دیارە حكومەتی عێراقی ئەو ڕێكخستنەی بە دامەزراوەیەكی كارگێری– سیاسی بینیوە، لەكاتێكدا دامەزراوەیەكی سیاسی– سەربازی بووە. بۆ دەقی نووسراوەكە بڕوانە: پاشكۆی ژمارە(٢).

١٥- عیسمەت شەریف وانلی: لە ٢١ی تشرینی دووەمی ١٩٢٤ لەدایك و باوكێكی كورد لەدیمەشق لەدایك بووە.یەكێكە لە كەسایەتییە ئەكادیمی و سیاسییە نەتەوەییە كوردیەكان. ڕۆڵی گرنگی لە شۆڕشی ئەیلوول وەك نوێنەری مستەفا بارزانی لە ئەوروپا گێڕاوە. بڕوانامەی ماجستێری لە مێژوو لە زانكۆی جنێف لە سویسرا و دكتۆرای لە ساڵی ١٩٧٠ لە زانكۆی پاریس بەدەستهێناوە. وەك مامۆستایەك لە زانكۆی سۆربۆن لە فەرەنسا وانەی گوتیتەوە. ساڵی ١٩٥٦ لەگەڵ ژمارەیەك لەهاوڕێكانی (كۆمەڵەی خوێندكارانی كورد لەئەوروپا دادەمەزرێنن و ساڵی ١٩٦٢ سەرۆكایەتی كۆمەلەكە دەكات. ساڵی ٢٠١١ لە شاری لۆزان لە سویسرا كۆچی دوایی كردوە. ( حصاف، شريف،٢٠٢١،ل٢٣٣-٢٥١).

١٦- باڵی مەكتەب سیاسی پارتی پێكهاتبوون لە : (ئیبراهیم ئەحمەد، جەلال تاڵەبانی، عومەر دەبابە، عەلی عەسكەری، حیلمی عەلی شەریف، عەلی عەبدوڵڵا، نوری شاوەیس، مەلا ماتۆر (عەبدوڵڵا ئیسماعیل)، سەید عەزیز شەمزینی، عەلی حەمدی، محەمەد حاجی تایەر، شەمسەدین مفتی و نوری ئەحمەد تاها). بڕوانە: بەڵگەنامەی ژمارە(٣٤) لە: شیركو حبیب، الكورد في وثائق الارشيف الوطني البريطاني(1958-1969)، ج2، القاهرة، 2019، ص١٣٧-١٣٨.

١٧- بۆ زانینی ناوی ئەندامانی هەڵبژێردراوی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستانی عێراق، بڕوانە:(محمد، ٢٠٢١، ل٦٦-٧٠).

١٨- خوری پۆلیس بێداری: ساڵی ١٨٨٧ لەناوچەی زاخۆ لەدایک بووە، دوای کودەتای بەعسییەکان لە ٨ ی شوباتی ١٩٦٣ پەیوەندی بە شۆڕشی ئەیلول کردوە. لە ٧ی ئەیلولی ١٩٧٤ لەشاری موسڵ مردووە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: ( هیزل(گۆڤار)، ژ(١)، هاوینی ٢٠٠٦، ل٢٨-٣٥).

١٩- ماری یولاها ئەندراوس تیادورس ئەیود بەرواری: لە گوندی دوری لە ناوچەی بەرواری بالا لە ناحیەی کانی ماسی ساڵی ١٩٣٨ لەدایک بووە. لەساڵی ١٩٦١ بەشداری شۆڕشی ئەیلولی کردووە و پەیوەندی باشی لەگەڵ مستەفا بارزانیدا هەبووە. لەساڵی ١٩٧١ لەشاری بەغدا مردووە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: ( هیزل(مجلة)، ع (3)، شتاء 2007، ص95-97) .

٢٠- سەبارەت بە پاشبەندی نهێنی بەیاننامەکە، بڕوانە: مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد(شۆڕشی ئەیلوول ١٩٦١-١٩٧٥)،بگ٣،ب٢، ٢٠٠٤،ل٣٤٢-٣٤٤).

٢١- سەبارەت بە کێشەو گفتوگۆیەکانی پرۆژەی یاسای ئۆتۆنۆمیی، بڕوانە: ( عەبدوڵلا، ٢٠٠٨،ل٢٤٥-٢٥٠).

٢٢ - بۆ نووسراوی پرۆژەی ئۆتۆنۆمی پارتی دیموکراتی کوردستان ، بڕوانە پاشکۆی ژمارە( ٣ ).

## ١٠- لیستی سەرچاوەکان :


- بەڵگەنامە بڵاونەکراوەکان

- د.ك.و، البلاط الملكي،(311/4333)، أوراق متفرقة/ البارزانيون(1943- 1949).

- د.ك.و، (311/737)، البلاط الملكي، المفوضية العراقية في طهران(1946-1949).

- **بەڵگەنامە بڵاوکراوەکان**

- FRUS. 1969_1976, Volume E_4,1971. https://history.state.gov/historicaldocuments/frus1969-76ve04/d292.
- CIA , RDP79-00927A004800110003-7 ,. washington, 1965. https://www.cia.gov/readingroom/document/cia-rdp79-00927a004800110003-7.
- CIA. LOC- HAK- 173-7-14-7, 2 November 1974. https://www.cia.gov/readingroom/document/loc-hak-173-7-14-7.
- CIA/. RDP79-00927A004800110003-7,the Kurdish war-round four, Washington, April 23, 1965. https://www.cia.gov/readingroom/document/cia-rdp79-00927a004800110003-7.
- CIA/ 741503699,Helms to Scowcroft re Mulla Mustafa Barzani and Dr. Uthman, March 1974. https://www.cia.gov/readingroom/docs/74_1503699.pdf.
- FCO. 8/2308, Kurds in Iraq, 1974. https://archive.org/details/self-rule-in-iraqi-kurdistan/mode/2up?q=8+2308%2C+Kurds+in+Iraq.
- FRUS. 1969–1976, VOLUME XXVII, Washington, March 21, 1974. https://history.state.gov/historicaldocuments/frus1969-76v27/d243.
- FRUS. 1969–1976, Volume XXVII,Tehran, March 18, 1974. https://history.state.gov/historicaldocuments/frus1969-76v27/d242.
- FRUS. 1969_ 1976, Volume XXVll, Washington, April 17,1974. https://history.state.gov/historicaldocuments/frus1969-76v27/d247.

- **بڵاوکراوە حکومییەکان**

- الوقائع العراقية ، ع(٢٨٣)، كانون الثاني ١٩٦٠.

- **ڕۆژنامەکان**

- خەبات(جريدة)، ع(١٦٧)، ١٩٦٠.
- النهار(جريدة)، الزعماء الاكراد قد يعلنون الحكم الذاتي من جانب واحد، ٩ ايار ١٩٧٤.
- الدستور(جريدة)،ع(1048)،12 أذار 1970.

- **یاداشت**

**بەزمانی کوردی**

- دەرگەلەیی،زرار سلێمان بەگ. بیرەوەریەکانم لە سالانی(ساڵانی) ١٩٤٣-١٩٧٧ دا، هەولێر، ٢٠٠٢.

**به زمانی عەرەبی**

- شاويس ,نوري .من مذكراتي، من منشورات حزب الشعب الديمقراطي الكردستاني .بغداد ,١٩٨٥.
- دزەیی، ,محسن .أحداث عاصرتها،ج٣، كوردستان، ٢٠١٣.

**به زمانی روسی**

- Судоплатов, Павел. Разведка и Кремль. Воспоминания опасного свидетеля,2016.http://loveread.me/read_book.php?id=57719&p=1

- **نامەی ماستەر**

- Lortz, Michael G. Willing to Face Death: A History of Kurdish Military Forces- the Peshmerga - From the Ottoman Empire to Present-Day-Ira . Florida: Florida State University, 2005.

- **توێژینەوە زانستییەکان**

- ئیسماعیل محمد حصاف، هاوکار کریم حمەشریف، عیسمەت شریف وانلی نوێنەری شۆڕشی ئەیلوول لە ئەوروپا ١٩٦٤-١٩٧٥،چالاکێن کۆنفرانسێ زانستێ نێڤدەولەتێ سێ کۆمەکا ڤەکولەران، شۆڕەشا ئەیلوولێ وەچەرخانەک د دیرۆکا سیاسی یا کوردی دا، کۆنفرانسا هەڤبەش یا دەستەیا ئینسکلۆپیدیایا پارتیا دیموکراتا کوردستانێ و زانکۆیا دهۆکێ، دهۆک،٢٠٢١.
- رەحمان، قارەمان حەیدەر. کاریگەریی دەستووری ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستانی عێراق لەسەر ڕەوشی ناوچە ئازادکراوەکان(١٩٦٤-١٩٧٠)، زانکۆ بۆ زانستە مرۆڤایەتییەکان(گۆڤار)، بگ٢١،ژ(٣)،٢٠١٧.

- **کتێب**

**بە زمانی کوردی**

- بارزانی، ,مسعود . بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد(١٩٣١ -١٩٥٨)،دهۆک ,١٩٩٨.
- بارزانی، ,مەسعوود .بارزانی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستان(شۆڕشی ئەیلوول ١٩٦١-١٩٧٥)،هەولێر ,٢٠٠٤.
- حەسەن ,شەوکەت مەلا ئیسماعیل .ڕۆژانێ لە مێژووی شۆرشی ئەیلوول ١٩٦١ _١٩٧٥ .هەولێر ,٢٠٠٧.
- حەمەدئەمین، ,د.ئەحمەد. پارتی دیموکراتی کورد -عێراق –بەرەی پێشکەوتوو(١٩٥١-١٩٥٦)،هەولێر ,٢٠١٧.
- محمد، د.شێرزاد زکریا. ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕەشی ئەیلوول لە کوردستان _عێراق ١٩٦٤_١٩٧٠ .، و: هەندرێن شێرزاد .دهۆک ,٢٠٢١.
- ساڵح، ,د .ئازاد عوبێد. شۆڕشی ئەیلوول لە ژمارە)یەکی (گۆڤاری)دەنگی کوردستان ".(شۆڕەشا ئەیلوولێ وەچەرخانەک د دیرۆکا سیاسی یا کوردی دا .دهۆک :سەنتەری بێشکچی بۆ ڤەکۆلینێن مرۆڤایەتی/زانکۆیا دهۆک ,٢٠٢١ .٣٥٣.
- ساڵح، ,ئازاد عوبێد .کاریگەریی شۆڕشی ئەیلوول لەسەر ڕۆژنامەوانی کوردی ١٩٦١-١٩٧٥، .کوردستان ,٢٠٠٧.
- سوڵتانی، ,محەمەد عەلی. بارودۆخی سیاسی، کۆمەڵایەتی و مێژوویی عەشیرەتی بارزان .، و: کامبیز ئیبراهیم زادە .مهاباد ,١٣٩٩ش.
- عومەر، ,شێرکۆ فەتحوڵا .پارتی دیموکراتی کوردستان و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی کورد لە عیراقدا ١٩٤٦_١٩٧٥، و: سوارە قەڵادزێی . سلێمانی ,٢٠١٣.
- عیسا، ,د .حامید مەحمود .کێشەی کورد لە عێراقدا، و: سوارە قەڵادزەیی .هەولێر ,٢٠١٤.
- عەبدوڵڵا ، فەرەیدوون عەبدوڵرەحیم . بارودۆخی سیاسی کوردستان- عێراق (١١ی مارت ١٩٧٠-١١ی مارتی ١٩٧٤) ،هەولێر، ٢٠٠٨
- کوردو کوردستان لەبەڵگەنامە نهێنییەکانی حکومەتی فەرەنسا و بەریتانیادا ١٨٧٩-١٩٦٣ .ئـــا: نەجاتی عەبدوڵڵا ،هەولێر ,٢٠٢١.
- کۆچێرا ,کریس .کورد لە سەدەی نۆزدە و بیستەمدا، ،چ٦، .و: حەمە کەریم عارف .هەولێر ,٢٠١١.
- کەریمی، ,عەلی .نیشتمان بیری کۆمەڵەی ژ.ک .سلێمانی :بنکەی ژین ,٢٠٠٨.
- قادر، مەهدی محەمەد. پێشهاتە سیاسییەکانی کوردستانی عێراق(١٩٤٥-١٩٥٨)، بڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجیی کوردستان، سلێمانی، ٢٠٠٥.
- سەرنی، هوژین مسعود. شورەشا ئیلونێ ل دەڤەرا بەهدینان ١٩٦١- ١٩٧٥، زاخۆ ، ٢٠١٨.
- هەروتی، ,د .سەعدی عوسمان .بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردی .هەولێر :دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی ,٢٠٠٦.
- ئەردەلان، ,د .ئیسماعیل .نهێنییەکانی بارزان.، و: رەنجبەر شەوکەت پیرانی .هەولێر ,٢٠٢٢.
- ئەمین، ,نەوشێروان مستەفا .حکومەتی کوردستان )ڕێبەندانی ١٣٢٤ _سەرماوەزی ١٣٢٥ (کورد لەگەمەی سۆڤێتی دا .سلێمانی :سەنتەری لیکۆڵینەوەی ستراتیجیی کوردستان ,٢٠٠٧.
- ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستان -عێراق)نووسینگەی ڕاپەراندن (دەستوور و یاساکان ١٩٦٤-١٩٦٥ئـــا: ئاری فاروق نانەکەلی .هەولێر , ٢٠١٧.

**بەزمانی عەرەبی**

- بارزاني ,أيوب .الحركة التحررية الكوردية و صراع القوى الاقليمية والدولية ١٩٥٨ _١٩٧٥ .جنيف :دار النشر حقائق المشرق ,٢٠١١.
- البارزاني ,مسعود .البارزاني والحركة التحررية الكردية ,(ثورة بارزان)١٩٤٣_١٩٤٥ .كردستان ,١٩٨٦.
- البارزاني، ,عزيز حسن .الحركة القومية الكوردية التحررية ١٩٣٩-١٩٤٥ .هولير ,٢٠٠٢.
- البوتاني ,د .عبدالفتاح علي .ملا مصطفى البارزاني قائد الثورة الكوردية و ملهمها .دهوك :مركز الابحاث العلمية والدراسات الكوردية، ,٢٠١٢.
- البوتاني، ,د .عبدالفتاح علي .منطقة بادينان)١٩٢٥ _١٩٧٠ (دراسة في الوقائع والتطورات السياسية، الجزء الاول)١٩٢٥_١٩٥٨ الاكاديمية الكوردية،اربيل2017 .
- جواد ,سعد ناجى .العراق والمسألة الكردية ١٩٥٨ _١٩٧٠، .لندن ,١٩٩٠.
- حبيب ,شيركو .الكورد في وثائق الارشيف الوطني البريطاني١٩٥٨_١٩٦٩، ج٢ .القاهره ,٢٠١٩.
- حيدر نجم عبد مراد، معجم ضباط ثورة أيلول 1961_1975، م: د. أزاد سالم محمد، دهوك، 2021.
- الخرسان ,صلاح . التيارات السياسية في كردستان العراق(قراءة في ملفات الحركات و الاحزاب الكردية في العراق) ١٩٤٦_٢٠٠١ .بيروت :مؤسسة البلاغ للطباعة والنشر والتوزيع ,٢٠٠١.

- حصاف، د. أسماعيل محمد . كردستان و المسالة الكوردية. أربيل: مؤسسة موكرياني للبحوث والنشر، 2009.
- شيرگوه، د. بلەچ. القضية الكردية- ماضي الكرد و حاضرهم ( جمعية خويبون الكردية الوطنية)، النشرة الخامسة، رابطة كاوا للثقافة الكردية، دار الكتاب، بيروت،1986 .
- حصاف، د.اسماعيل محمد. تاريخ كردستان سوريا المعاصر(1916-1946)،ج1، أربيل،2017
- سوبوبالتوف ,بافل .البارزاني و شهادة ألتاريخ محموعة أبحاث و أنطباعات للمؤلفين الكورد والروس، ت:د .بافي نازي ،عبدي حاجي .دهوك، ٢٠٠٥.
- الطالباني ,جلال .كردستان والحركة القومية الكردية، ط١، .بغداد :منشورات النور، ,١٩٧٠.
- عقراوي، ,شكيب .شكيب عقراوي، سنوات المحنة في كردستان )أهم الحوادث السياسية والعسكرية في كوردستان والعراق من )١٩٥٨-١٩٨٠، ط٢، .أربيل ,٢٠٠٧.
- قاسملو ، ,د.عبدالرحمن .كردستان والكرد )دراسة سياسية و أقتصادية .السيمانية :بنكەی ژين ,٢٠٠٨.
- كريم ، ,حبيب محمد .تاريخ الحزب الديمقراطي الكوردستان -العراق)في محطة رئيسية .1993-1946 (دهوک)، مطبعة خبات.1998 ,
- كوماروف ,دينيس .البارزاني و نضال الاكراد الجنوبيين، ت: د .بافي نازي ، عبدي حاجي .دهوك ,٢٠٠٥.
- المزوري، ,هلبين محمد أحمد .حزب هيوا _الامل .(1946_1939 )أربيل ,٢٠٠٨.
- وانلي، ,عصمت شريف .كردستان العراقية هوية وطنية (دراسة في ثورة 1961)، ت: سعاد محمد خضر .السليمانية :مطبعة شڤان ,٢٠١٢.

**بە زمانی ئینگلیزی**

- Joane, Nagel. the Conditions of Ethnic Separatism: The Kurds in Turkey, Iran, and Iraq. California, 1978.
- O'Ballance, Edgar. the Kurdish Revolt (1961-1970) . London, 1973.
- P.Chapman, Dennis. Security Forces of the Kurdistan Reginoal Government . United States, 2009.
- R.V.Stansfield, Gareth. Iraqi Kurdistan: Political Development and Emergent Democracy. London, 2003.
- Joane, Nagel. the Conditions of Ethnic Separatism: The Kurds in Turkey, Iran, and Iraq. California, 1978.
- O'Ballance, Edgar. the Kurdish Revolt (1961-1970) . London, 1973.

- **گۆڤار**

**بە زمانی كوردی**

- وەسفی حسێن ردێنی، قەشە پۆلس بێداری ئەو كەسایەتی كوردستان پەروەر و ڕۆشنبیر، هیزل(گۆڤار)، ژ(١)، هاوینی ٢٠٠٦.
- هيزل(مجلة)، ع (3)، شتاء 2007.

**بەزمانی توركی**

- SÖZERİ, FIRAT. ",BELGE VE MEKTUPLARLA MELA MUSTAFA VE SSCB İLİŞKİLERİ." Edited by Ekim-Kasım-Aralık. Kürt Tarihi, no. Sayı(38) (2019).

**دور مصطفى بارزاني**

**في تشكيل وقيادة المنظمات والمؤسسات السياسية (1945 - 1975)**

**سعدي عثمان هەروتي**
كلية الاداب - قسم التاريخ / جامعة صلاح الددين- أربيل
saadi.haruti@su.edu.krd

**قارمان حيدر رحمان**
كلية الاداب - قسم التاريخ / جامعة صلاح الددين- أربيل
qaraman.rahman@su.edu.krd

**ملخص**

يعتبر ظهور مصطفى بارزاني كزعيم لحركة التحرير الكردية بين عامي 1940 و 1975 نقطة تحول في تاريخ الحركة القومية الكردية. على هذا الأساس ، وصف دنيس تشابمان ، كبير المستشارين العسكريين الأمريكيين ، الزعيم بأنه والد حركة التحرير الكردية. لأن حركة التحرر الكردية في عهد بارزاني كان أحد عناصرها السياسية تشكيل وقيادة المنظمات والمؤسسات السياسية في جنوب كردستان ، مثل تشكيل لجنة الحرية عام 1945 وتأسيس الحزب الديمقراطي الكردستاني في آب / أغسطس. حكومة مؤقتة في باكو ، عاصمة أذربيجان السوفيتية ، في ديسمبر 1948 وإنشاء مجلس القيادة الثورية لكردستان العراق في عام 1964. في نيسان 1974 ، وبالتشاور مع قيادة حزب الديمقراطي الكردستاني ، قرر تشكيل مجلس للأمانات العامة لإدارة شؤون المناطق المحررة الخاضعة لسيطرة قوات البيشمركة الكردستانية. استمرت المؤسسة في تقديم الخدمات للشعب الكردي حتى نهاية الثورة.

كلمات الرئيسية : مصطفى, بارزاني ، ثورة ، أكراد ، كردستان.

**Mustafa Barzani's role**

**In forming and leading political organizations and institutions (1945-1975)**

**Saadi Othman Harruti**
History Department, College of Arts, Salahadin University-Erbil
saadi.haruti@su.edu.krd

**Qaraman Haidar Rahman**
History Department, College of Arts, Salahadin University-Erbil
qaraman.rahman@ su.edu.krd

**Abstract**

The emergence of Mustafa Barzani as the leader of the Kurdish liberation movement between 1945 and 1975 is considered a turning point in the history of the Kurdish national movement. On this basis, Dennis Chapman, the chief US military adviser, described the leader as the father of the Kurdish liberation movement. Because the Kurdish liberation movement during the Barzani era was one of its political elements, the formation and leadership of political organizations and institutions in southern Kurdistan, such as the formation of the Freedom Committee in 1945 and the establishment of the Kurdistan Democratic Party in August. Provisional government in Baku, the capital of Soviet Azerbaijan, in December 1948 and the establishment of the Revolutionary Command Council of Iraqi Kurdistan in 1964. In April 1974, in consultation with the leadership of the pdk, it decided to form a Council of General Secretariats to manage the affairs of the liberated areas under the control of the Kurdistan Peshmerga forces. The institution continued to provide services to the Kurdish people until the end of the revolution.

**Keywords**: Mustafa, Barzani, Revolution, Kurds, Kurdistan